پاشكۆی

# كاروان

تایبەتی‌یە بۆ
هەفتەی قادسیەی صدام‌و
جەژنەكانی ئازارو نەورۆز

6 ئــاداری 1983



# کاروان

تایبەتی‌یە بۆ
هەفتەی قادسیەی صدام‌و
جەژنەکانی ئازارو نەورۆز

گۆڤارێکی رۆشنبیری‌ی مانگانەیە
ئەمینداریتی‌ی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان
بەزمانی کوردی‌و عەرەبی دەری دەکا

پاشکۆی ژمارە 6 ئاداری 1983



لەم پاشـــکۆیەدا



ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمینداریتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان ـ گۆڤاری (کاروان) ـ ت : 20882

دەقی وتە گرنگەکەی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین :

# با رۆژنامەو وگۆڤارەکان پڕبن لە باسی



سەرۆکی فەرماندە صدام حسین رۆژی 1983/3/9 ، بە بۆنەی گفت‌وگۆ کردنی کارگەرانی دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی‌یەوە سەبارەت بە بەرنامەی کاری دەزگاکە لە کۆشکی رۆشنبیریدا بەسەری کردنەوە وتەیەکی بایەخدارو گرنگی ئاڕاستەی ئەوان‌و گشت جەماوەری گەلی عێراقمان کرد کە ئەمە دەقەکەیەتی .

# کورد و مێژووی کورد و ڕۆشنبیریی کوردی

**شادمانم بەوەی لەم شوێنەدا چاوم بە دەستەیەك خێر خوازی گەلی کوردی عیراقیمان بکەوێ . ئەوانەی نوێنەرایەتی ڕۆشنبیرانی کورد دەکەن ، جا لە خودی خۆیاندا یان لە ماوەی ئەوئەر کانەوە بە هەرجۆرێ لە جیاتی ئەوان بە جێ دەهێننو نالێم نوێنەرایەتی سەرجەم ڕۆشنبیرانی کورد دەکەن هەتا هەندێ ڕۆشنبیری کوردی بەرهەلستکار ، ئەگەر هەبن «زیورنەبن» .**

● **دەواری عیراقیەت :**

گوێم لە لایەنێکی گفتوگۆکان بوو ، هەروەك ئاسایی وایە نامەوێ قسە لەسەر گفتوگۆکان بەمانای تەکنیکی بکەم ، بەڵکو بەمانای گشتیو سەرتاپاگیر ، دەڵێم ، ئێمە لە عیراق ، کاتێ باسی کوردایەتیمان دەکەین ، شتێ نیە بۆمان عەیب بێ یان نیشتمان پەروەریەتی عیراقیمان لەنگ بکا ، بەڵام ئەوەی لەنگی دەکا ئەوەیە کە باسی کوردایەتیمان بەدابراو لە دەواری گەورەی عیراقیە تمان بکەینو بەدابراو لە ئەرکەکانمان بەرامبەر تێکرای عیراقی مەزن ، چی لە چوارچێوەی بەرپرسیاریماندا وەك فیکری یان لە چوارچێوەی هەڵسوکەوتی کاری ڕۆژانەماندا دەیبینین ، هەر بەو جۆرەش کە باس لە تورکمانیەتو تورکمان دەکەینو کاتێ باسی هەموو خاسیەتە عیراقیە کان لە وڵاتە ئازیزەکەماندا دەکەین .

ئەمەیە عیراقو تاقە وڵاتیش نیە لە جیهاندا خاسیەتی نەتەوەییو ئاینیو تیپو تایفەی لە چوارچێوەی ئاینەکاندا تیابێ .

ئەگەر وڵاتانی ئەوروپا وەربگرین کە لە شارستانیەتو مەدەنیەتی نوێدا پێشمان کەوتوون ، دەبینین ، هیچ وڵاتێ نیە بێ ئەم خاسیەتە نەتەوەییە هەمەچەشنانە ... ئاینی هەمەچەشنەو ... تایفە لە چوارچێوەی یەك ئایندا و ... ئەمە حاڵی دنیایە ... هەندێ وڵات ئەم خاسیەتانە تیایاندا دەگاتە

دەیان خاسیەت ، بەجۆرێ عیراق بە حاڵەتێکی بچوك دادەنرێ لە خاسیەتەکاندا .. بە پێوانەی ئەو خاسیەتانە ... ئەگەر خاسیەتەکانی عیراق تا ئەو ڕادەیەی دەستمان بۆ کێشا لە هیتر کەمتربێو واقعیش وایەو ... ئەگەر عیراقیەك بەرگەی ئەم خاسیەتانە نەگرێو لەناویا بە شێوەیەکی ڕاست

هەڵسوکەوت نەکا ، ئەوە ئەو عیراقیە نیە شانازی پێوە دەکەین دەربارەی دەخوێنینەوەو کە ئاڵاو مانای پەیامی مرۆڤایەتی بۆ هەموو مرۆڤایەتی هەڵگرت کاتێ یەکەم شارستانیەتی بیناکرد ... ئەگەر عیراقی مەزن بەم خاسیەتانەوە بناڵێنێ کە

کەمترە لەوەی وڵاتانی تر دەبێ حاڵەتی وڵاتەکانی تر چۆن ببینین ... ئەگەر وامان بینی چارەسەری کاروباری

دەکاتو مامەڵە لەگەڵ ژیاندا بەبێ هەست کردن بە هیلاکی دەکا ... بەبێ هەستکردن بە خاوو خلیچکی ... بەبێ ئەوەی

ئەم خاسیەتانە لە هەڵسو کەوتی دەوری نیشتمانیو نەتەوەییو مرۆڤایەتی دووربخاتەوە ... چۆن دەبێ عیراقی لەم

خاسیەتانە وابکەن نەیەڵێ مامەڵەی لەگەڵ ژیانو لەگەڵ یەکێتی گەل لە چوارچێوەی ڕاستەقینەیدا بکات .



● **گەلو حزب :**

کەواتە ، بەیەقین ، عیراقی .. ڕۆڵەی ئەم
میژووناسراوەی درێژایی ڕۆژگار لە کەسانی تر بەتوانا ترە لە
مامەڵەکردندا لەگەڵ ئەم خاسیەتانەدا ... ئەگەر لە گەڵ

کەسانی ترا یەکسانبێ ، ناکرێ لە هەموو حاڵێکدا ڕادەی لەم
کەمتربێ ، بەڵام قسەکردن لەسەر خاسیەتەکان تا ڕادەی نوقم
بوون ، ئەوە هەستکردنە بە سڵەمێنەوەو حەساسیەتو هەندێ

جاریش هەست بەبچوکی تیایە .

وەرێگام بدەن ، من هەمیشە ڕاستگۆم لەگەڵ
عیراقیەکاندا ، من دەڵێم ، ئیستائەوەی بەردەوام ، زۆر قسە
لەسەر حزب دەکا ، مانای ئەوەیە ، یان هەست بە بچوکی

دەکا ، یان هوشیاری کەمەو لەوانەیە ئەم قسەیەم هەزاران
بەعسی «زیور» بکا ، مەبەستم لەوە ، کاربەدەستانی گەورەیە لە
دەوڵەتو لە حزبدا ... چونکە ئەگەر صدام حسین لە



باسکردنیو قسەکردن لەسەر حزبی بەعسیو بەعسیەکاندا نوقم بوو ، کێ وتویەتی هەموو عیراقیەکان حزبیو ڕێکخراون ... وەلام نەء ... گەلی عیراق ، ئەولە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست گەورەترە و .. حزب حالەتێکی کەمە لەناو گەلداو کاتێ ژمارەی بەعسیە ڕێکخراوە کان دەپێوین بە مانای نیسبەتی کەمی ، کەم نیە بە پێوانە بۆ نیسبەتی گەل ... چونکە نیسبەتی حزب بە پێوانە بۆ گەل پێویستە کەمتربێ ...

چونکە قسەکردنی لەسەر نیسبەتی حزب لە نێوان ژمارەی هاونیشتمانیە عیراقیەکاندا زیاترە لە نیسبەتی وەرگیراو ..

## ● پاڵەوانیەتی مەزن

لەبەرئەوە دەبێ نیسبەتی ڕێکخراوەکان کەم یکەبنەوە بۆ ئەوەی کار هاوسەنگ بێت ، ئەگەر بەرامبەر بە حزبی شیوعی سۆڤیەت بۆ گەلی سۆڤیەت پێوانەمان کرد یان ئەگەر حزبی شیوعی چین بۆ گەلی چینی یان کۆمەڵەی شیوعیەکان یۆگۆسلاف بۆ گەلانی یوگۆسلاڤیا ، وەفلانە حزب بۆ ژمارەی



دانیشتوان ، بەلکو ئەلێم هەر حزبێك یان هەر سەرکردایەتیەك یان هەر لایەنێك لە کاتێکا رابەری گەل دەکات پێویستە هەست بەوە بکات کە گەل لەو گەورە ترەو ئەو خزمەت گوزاری گەلە ، بەبێ ئەم هەستە بۆچوونەکان هەڵدەگەرێنەوەو لەرێ لادان رودەدا ، یا لەبەرئەوە بۆ نمونە ناگونجێ بۆ ئەندامێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش کە قسەکانی وەردەگرین لە سەرەتاو تا دوای بریتییە لە حزبی بەعس ، ئەمەی وت وە

حزبی بەعس وا کاری کردوە حزبی بەعس وای کردوە حزبی بەعس پاڵەوانە ، لە سەرمانە پاڵەوانێتی حزبی بەعسمان لە بیرنەچێ ، بەلام لە هەمان کاتا لە سەرمانە ئەم پاڵەوانێتیە بخەینە چوارچێوەی پاڵەوانێتی مێژووی گەورەترەوە کە پاڵەوانێتی عیراقیەکانو گەلی عێراقە ، ئەگەر بە پێچەوانەی ئەمەوە هەلسو کەوتمان کرد لە رادەی بەر پرسیاری سەرکردایەتی بالادا ئەوەیان بچوکین بەپێی بۆچوونی کورت بینیمان لە مامەلە کردنماندا لەگەل ژیانو حەقیقەتەکانیاو رۆژگارو پێداویستییە ـ کانی یان ئەوەتە ئالۆزییەکی نەفسیمان هەیە پێویستە وازی لێبهێنن هەتا بە شێوەیەکی ئاسایی لەگەل ژیاندا مامەلە بکەین .

● **خاسیەتیەکانی عێراقی :**

هاوولاتیانی عێراقی لە عێراقدا چاویان پێمدەکەوێ هەندێ جار لە عێراقیەك دەپرسم پێی دەلێم تۆ خەلکی کوێی . ئەلێ قوربان من کوردم ، پێدەکەنم و پێی دەلێم چاکە بەلام من لە نەتەوەکەتم نەپرسی من لێمپرسیتو وتم تۆ خەلکی کوێی دەلێت من خەلکی سلێمانیم چونکە ئەم جۆرە بەرچاو خستنانە من وای دادەنێم نوقوم بونە لە خاسیەتیەکاندا بەهۆی بارێکی نەفسی تایبەتەوە کە لەسەرمانە وازی لێبێنین بەلام لەهەمان کاتدا من لەو بارە نەفسیە دەگەمو بەرێگایەك چاری رۆلەیەکی بەصرەی پێدەکەم کە لێی دەپرسم تۆ خەلکی کوێتو وەدەلێ من عەرەبم لە بەصرە ئەمە بەکفر دەزانم بەلام کاتێك پرسیار لە عیراقیەك دەکەموە دەلێ من کوردم بە کفری

نازانم چونکه له دایک بوونی مێژوویی و نەفسی ئەم حاڵەتەو بەستراوەیی بە ڕۆژگارەکەیەوە لەبەرچاو دەگرم بەو جۆرە هەڵسوکەوتی بەرامبەر دەکەم بەڵام لە هەمان کاتدا وەک بەرپرسیار لە عیراقیەکان وەلە شوێن خۆمەوە وا کاردەکەم ئەم خاسیەتە حاڵەتێکی زیادەڕۆی نەبێ لە کاروبارو لە ڕوانینا لەگەڵ ئەوەشدا ئەڵێم قسەکردن لەسەر کوردایەتیمان بێ هێزمان ناکات مادام باس لە چوارچێوەی عێراقیە تیماندا دەبێ و - شانازی کردنە.



## ● دەوری مێژوویی :

جادەبێ ئەم حاڵەتە وا لێبکەین باو بێت هەتا لە ڕاگەیاندنی ئاراستەکراو بۆ گەلی کوردمان تێر دەبێ ، باوی بکەین و وابکەین ڕۆژنامەکە لە سەرەتاوە تا دوایی پڕ بێت لە باس کردن دەربارەی کوردو مێژووی کوردو ئەدەبی کوردو ڕۆشنبیری کوردو هەرگیز ، هەرچیمان بۆ یەت بڵاوی دەکەینەوە دوای ئەوە گەلی کوردمان تێر دەبێ و ڕوشنبیری کوردی و هونەری کوردی .. هتد دەبینی .. هەمووی باسی دەکرێ حاڵەتیکی بریقەدار نامێنێ بۆ مەبەستی بەرهەڵست کاران بەڵکو حاڵەتەکە وای لێدێت ئەو وەختە کوردێک لە سلێمانیەوە دێت پێت دەڵێ (بەس) باسی ئەدەبمان بۆ بکەلە کوبا ، ئەدەب لە جزائر ، ئەدەب لە ئەندەلوس لە قۆناغی ئەندەلوسیا با سەرنجی حاڵەتەکانی ژیان بدەین بە هەموو وێنە گشتی یەکانیەوە تەنیا لە گۆشەیەکدا گیرمان مەکە ، بەڵام ئەگەر وا مامەڵە لەگەڵ ئەدەبی کوردی و ڕۆشنبیری کوردیا بکەن ، بە ئەدەب و هونەرەوە ، هونەر ، ڕەسم ، نەحت ، مۆسیقاو گۆرانی لە ئێستەوە مامەڵەی وا لە گەلا بکەن لە چوارچێوەیەکی هاوسەنگدا حاڵەتەکە هەروا ئەمێنێتەوە وەک ئەوەی خەڵکی تر هەبن باسی زۆرتریان بوێت ، چاکە ، باس کردنەکە باوبکەن گۆڤارو ڕۆژنامەکان زیاتر پڕ بکەنەوە بە نوسین لەسەر ئەدەبی کوردی ڕۆشنبیری کوردی هونەرو شعری کوردی هەتا گەلی کوردمان تێر دەبێ ، دوای ئەوەی تێر دەبێ بڕۆن بەرەو هاوسەنگی وە باسی عیراقیەتتان بکەن بە هەموو شتەکانیەوە چونکە دەوڵەمەند ترو لایەق ترە بۆ کوردی عیراقی لەوەی تەنیا لە گۆشەیەکدا گیری بکەن چونکە ئەگەر پێمان ووت مێژوە کەت تەنیا کوردی یە وەک ئەوە وایە جنێو بە کوردی عیراقی بدەی چونکە مێژووەکەی بۆ هەزاران ساڵی شارستانیەت دەگەڕێتەوە کە شارستانیەتی عیراقە وە بۆ تەقەللایەکی نمونەیی لە بیناکردنی شارستانیەتی ئیسلامی عەرەبیدا ، ئەگەر تەنیا لە گۆشەیەکدا گیرمان کرد ئەوا لە دەوری مێژوویی مەزنی لە دروستکردنی ئەو شارستانیەتە بێبەش دەکەین ئایا ئەمە دەبێت ، وەڵام .. ، نەء ، چونکە ئەوسا بەبێ ئینصاف هەقی خۆی گەلی کوردمان نەداوە ، هەڵە لە تێگەیتستنی هەندێ ناو لێناندا هەیە بۆ نمونە ، وا بزانم وێنەیەکم لایە لە ژێریا نوسراوە پاڵەوانی ڕزگاری نەتەوەیی صدام حسین کە ئەبیستم هەست بە ڕەزامەندی ناکەم بۆچی ، چونکە نەتەوەیی بە بۆچونی گشتی حاڵەتی هەموو گەلی عێراقە بەڵام بەپێی بەکارهێنانی بێگانە وەک یەک بەکاری ئەهێنن نیشتمانی یان نەتەوەیی لە یەک نزیکن ، بەڵام وا هەست دەکەم کوردێک لە گەلەکەمان کە پاڵەوانی ڕزگاری نەتەوەیی دەخوێنێتەوە وا دەزانێ مەبەست لە نەتەوەی عەرەبیە نەک عیراقی ئەگەر لە ڕۆژێکا هێزێکی گەورە ترمان هەبووە ویستمان یارمەتی عەرەب بدەین لە دەرەوەی سنورمان ئەوە شەرەفێکی گەورەیە بۆ هەموومان وەک عیراقی وە لە ناو عیراقیەکانا صدام حسین واتە چی ڕووئەدا ئەگەر بڵێن پاڵەوانی ڕزگاری بەبێ نەتەوەیی ئەوسا کە عیراقی دەیخوێنێتەوە هەموویان هەست دەکەن لەمەدا بەشیان هەیە .



● **یەك گەل :**

کەواتە پێویستە ئاگاداری دەربرین بین لە لایەنە دەروونیەکەیەوە .. کاتێ صدام حسین ، بۆ نموونە ، زۆر باسی برایەتی کوردو عەرەب ، عەرەب‌و کورد ، برایەتی عەرەب‌و کورد برایەتی کوردو عەرەب دەکا ، وا دەردەکەوێ وەگولەگەڵ رۆژگاردا دیوارێکی جیاکردنەوە دروست کات نەك پردی تێکەڵ بوون .

زاراوەیەکی دیکەش هەیە ... برا کوردە کانمان ، ئەمە مانای چیە . وەکو کوردە کان لە دەرەوەی سنووری عیراقن یان دراوسێی عیراقن .. برامانن وەکو چۆن دەڵێین برا ئوردونیەکانمان ، برا سوریەکانمان ، برا کوردەکانمان .. مەبەستم ئەوەیە هەندێجار خەڵکی هەندی وشەو زاراوە بەکاردەهێنن بەلام ئاگاداری کارتێکردنە دەروونیەکەی نین‌و لە هەمان کاتدا نازانن کە چەند لە مێشکدا جێگەیەکی دەروونی خراپ بەجێدەهێڵێ .. کەواتە من دەڵێم نابێ بڵێین برا کوردەکانمان .. ئەوان بێگومان برامانن چونکە هەموو عیراقی‌یەك برای عیراقی‌یە کەی ترە .. وا هەست دەکەم کە رستەی (برا کوردەکانمان) مانای جیاکردنەوەی تیادا هەیە ، هەروەهابرا تورکماکانمان .. واتە ئێمە کە کاتێ باسی یەك میللەت دەکەین کە ئەویش میللەتی عیراقە سنوورێك لە نێوانیاندا دادەنێین .. ئەم میللەتەمان وەکو چەند جارێکی تر وتومانە چەندین ئاین‌و نەتەوەو تایەفەی تیایە .. تایەفە لە ناو ئاینەکانداو تیپی هەمە جۆر لەناو تایەفەکاندا .. هتد کە هەندێ رواڵەتی تایبەتی زانراون .

● **بەرگری‌کردن لە عیراق :**

ئەوی کە ئومێدی دەکەم‌و هەروەکو بە جەنگاوەرەکانم وت .. کە هاووڵاتیە کوردە کانی گەلەکەمان نابێ دەوریان لە دەوری عەرەبی گەلەکەمان کەمتر بێ لە مەیدانی بەرگری کردن لە عیراق .. چونکە ئەم ماوە مێژووییە لەبەرچاو دەبێ‌و ئەنجام‌و کارکردن‌و هۆیە کانی‌و تا سەدان ساڵی ئاییندە ش دەخوێندرێ ،

ئێمە لەو کاتەوە عیراقمان خوش دەوێ .. کە دواکەوتوو دەوری پلەی دووهەم‌و سەرشۆڕکراوو چەوساوە بوو .. خۆشمان‌دەوێ‌و بۆ ئەم رۆژە تێکۆشاین .. بۆ ئەوەی خزمەتی بکەین‌و بنیاتی بنێین‌و بیپارێزین .

## ئۆباڵی وڵاتتان بە سەرەوەیە

چۆن دروستە عیراقی بیەوێ هەموو شتێکی بۆ رێك‌وپێك کرابێ ئەنجا عیراقی خۆش‌بوێ چونکە ئەمە هیچ شانازی‌یەکی تیا نیە ئەو کەسە دەتوانێ شانازی بکا کە ئافرەتێکی لادێیی وای خۆش‌بوێ خوێند ن‌و نووسین نەزانێ‌و نەزانێ چۆن لەگەڵ خەڵکدا بجووڵێتەوەو بێ جل‌وبەرگی باشی لەبەرکا و باش فێری‌بکاو .. هتدو ئەنجا بلێ ئەم ئافرەتە خەڵکی فلان دێی هەولێرەبۆ وێنەو ئەبینن ئیستە چیم لێ‌کردوە .. بەلام یەکێ بێت ئافرەتێکی شارستانی‌و رێك‌وپێك بینێ دەبێ هیچ شانازی‌یەك بەوەوە بکا کە شارستانی‌یە .. وەلام .. ناء .

وڵاتی ئێوەیەو ئۆباڵی بە سەرتانەوەیە .. ئێوە بنیاتی دەنێن‌و .. ئێوە شیعری بۆ دەنووسن‌و ئێوە مۆسیقای بۆ دادەنێن‌و ئێوە گۆرانی بۆ هەڵدەبەستن‌و گۆرانی پیوە دەڵێن‌و .. ئێوەشیر هەڵدەگرن بۆ پاراستنی‌و بنیاتنانی شارستانی ی تازەی بە هەمان گیانەوە .

## قسەی ڕاست

بەلام یەکێ بێ هەندێ پارەی پێ بێ چەند تفەنگو گوللەیەکی لە فلان دەولەتەوە وەرگرتبێ بۆ ئەوەی دوو تەقە بکا لە شاخدا .. ئەمانە کێ داخیان بۆ دەخوا چونکە لە دەرەوەی ڕەوتن و یەکێ داخ بۆ پلەی ئەقلیان دەخوا چونکە لە دەرەوەی مێژووەوە ڕەفتاردەکەن .. جۆرەشتی وا چوار یا پێنج یا دە یاسەد یا دووسەد پاش پانزە یا دە سالی تریش دەیانبینن لە شاخ .. بەلام یەکێ بەزەیی بە حالی ئەمانەو ئەم هەلویستەیان و ئەم جێگایەیاندا دێتەوە کە تیایان چونکە لە شەرەفی بەشداری کردن لەو ڕەوتە مەزنە بێ بەشن لەبارەی شانازی و هاوبەشیدا .

چ لەناو حزبی بەعس چ لە ناو گەلدا کەسی وامان بینیوە کە پێش ئەوەی دەست بکەنە قسەکەیان دەلێن هەمیشە ئێوە دەزانن برایان و هاوڕێیان دەلێ من بە سەراحەت قسەدەکەم .. باشە برا بلێ بە سەراحەت قسە دەکەم .. بەلام لای وایە سەراحەت هەر لە ڕەخنەگرتنایەو .. ئەوە نازانێ سەراحەت ئەوەیە قسەی ڕاست بکەی ئەگەر ڕەخنە بێ یا ڕەزابوون و لە هەموو ڕوالەتەکانی ئازایی گرنگتر ئەوەیە یەکێ ڕاست بلێ و لەگەلیا بژی ئیتر چ نەویستن بێ یا ویستن و قایل بوون و لەگەلا ژیان .. ئادەمیزادی سەریح ئەوە نیە هەر ڕەخنە بگرێ .. سەریح ئەوەیشە هەلدەگرێ و بەرگریشی لێ دەکاو .. شیریشی بۆ هەلدەکێشی لەپێناویا .. ئەگەر سەریحیش بین لە وەرگرتنی شتی ڕاست و ناسەریح بیر لە چاککردنی هەلەدا دەکەوینە بارێکی لەنگەوە و ئەگەر هاتو سەراحەتی ڕەخنەگرتنمان وەرگرت و سەریح نەبووین لە وەرگرتنی شتی ڕاستدا دیسانەوە بار لەنگ دەبێ لە بیرو دەروون و کەسایەتی و ڕەوشتمانا .

## کردەوەی ڕاست

باسی پێداویستەکانو گوشاردنی پێداویستە ـ کانتان کرد بەهۆی باری شەڕەوە .. با بیرێ لەم پێداویستانە بکەینەوە ئەگەر حزبێکی نهێنی بین ئایا بەشمان دەکا یا بەشمان ناکا لە بلاوکردنەوەی ڕۆشنبیری کوردیدا بەو پەڕی فراوانی یەوە .. من دەلێم دەجار یا بیست جار بەشمان دەکا .. پێش شۆڕش ئێمە لە حزبدا تەنها سێ ئۆتۆمۆبیلمان هەبوو .. لایشم وایە تەنها چوار مەلبەندی نهێنی یشمان هەبوو بۆ هەمووی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست .. ئایا دەتوانین بە دە یەکی ئەم توانایە ڕۆژنامەی هاوکاری بگەیەنینە دوورترین شوێن .. دەیگەیەنین .. کە وابوو با وەك خەباتکەران لەباری ئیستای ولاتتاندا کە ئاشکرایە واتا با هەر وا بیرنەکەینەوە کە مرۆڤی بەکار ئەوەنیە کە کاری ڕاست دەکا لە چوارچێوەی بوونی ئەو توانایەدا کە دەیەوێ بەلکو بەو وردی یەی کە بە پێی بارودۆخ بۆی دەلوێ .

کە وابوو تێ بکۆشن و خۆتان وەك ئەوانە تەماشابکەن کە لە بەرەدا شەڕ دەکەن .. یا دەبێ خۆتان لە بارێکی دووقاتدا دابنێن چونکە داواکراوە لێتان .. مەبەستم ئەوەیە هەریەکێ لە بەرەدا چەکی هەلنەگرتبێ لێ ی داوادەکرێ ئەگەر لە پشتەوە بێ لە بەغدا یا لە سلێمانی بێ یا لە کەرکوك بێ ئەگەر دەوری ئەوەی نەهاتبێ چەك هەلگرێ بە ژن و پیاوەوە دەبێ وەك فەرمانبەرێکی باری ناوەخت ئیش بکاو لە هەمان کاتیشدا وەك عیراقی یەکی داوالێکراو ئیش بکا چونکە نەچوە بۆ بەرەو وەك براکانی چەکی هەلنەگرتووە .. ئەگەر بەم گیانەوە ئیشمان کرد دەبینن ئەو توانایەی ئێستە هەمانە لە پێویست زیاترە .

لە هەموو بارێکدا داوا لە براکانم دەکەم لەم کۆڕەدا کە پێوەندی یان بە سەرپەرشتیکردنی ڕۆشنبیری کوردی یەوە هەیە حەساسیەتیان نەبێ بەرامبەر بە ڕۆشنبیری ی کوردی و داوا لەوانی تریش دەکەم زۆر نوقمی تایبەتی یەکانی کوردی نەبن بە جۆرێکی وا ئالای بەرزترو گەورەتریان لە بیر بچێ کە ئالای عیراقی یەتەو دەوریانە لە بنیاتنانی شارستانی مەزندا .. کاتێ کە بەغدا ئالایەکی بالای هەموو مرۆڤایەتی بوو کاتێ کە بابل ئالایەکی بالاو ئاشوور ئالایەکی بالای هەموو مرۆڤایەتی بوون .

داوای سەرکەوتنتان دەکەم .. سوپاس .



# ئازار .. مانگی

گومان لەوەدا نیە کە ئاهەنگە نیشتمانیو نەتەوایەتیەکان گرنگیەکی گەورەیان هەیە لەژیانی گەلاندا ، وەبەتایبەتی گەرهاتوو پەیوەندیەکی مێژوویی بە یەکیانەوە ببەستێتەوە ، جگە لەوەی کە دەورێکی کارگەریشی دەبێت لەرووی گۆڕانو گۆڕانکاریەوە ، لە بوارەکانی رامیاریو ئابووریو کۆمەلایەتیو شارستانیەتدا بەگشتی ..

لەم روانگەیەوە دەبێ گەلی کوردمان گەڕانەوەی مانگی ئادار بەهەل بزانێ بۆ ئەوەی بەوپەڕی خوشیەوە ئاهەنگی تیادا بگێڕیو بیرەوەریەکانی بەسەر بکاتەوە ، بەتایبەتی کە گەلی کوردمان هەر لەکۆنەوە بەیادکردنەوەی ئەو بیرەوەریە نیشتمانیو نەتەوەییانە ناسراوە کە لەم مانگە جوانو قەشەنگەی بەهاردا هەن ، وەکو بیرەوەری جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمی کوردوستان لەژێر سایەی شۆڕشی (17 — 30) ی تەموزدا ، کە چارەسەری مەسەلەی کوردی کرد بە شێوەیەکی ئاشتیو دیموکراتیانەو مافە نەتەوایەتیە ڕەواکانی بۆ زامن کرد ، تاوەکو لە ژیانێکی ئاسوودەو سەربەستدا بژیت ، هەروەها لەم مانگەدا بیرەوەری نەتەوەییە پیرۆزەکەی کوردە ، کە ئەویش جەژنی « نەورۆزە » وئێستا بە شێوەیەکی رەسمی ئاهەنگی بۆ ساز دەکرێو بە یەکێ لە دەستکەوتە مەزنەکان دەژمێردرێ کە شۆڕشو حیزب بو گەلی کوردمانی هینایە دی لە عیرقدا ، هەر لەتەك ئەوانەشەوە بیرەوەری سەرکەوتنی گەلی عیراقمانە بە عەرەبو کوردو کەمە نەتەوایەتیەکانی تری بەسەر مۆنۆپۆلە نەوتیەکاندا ، کە بە درێژایی چەندین سالو لەژێر سایەی حکومەتە کۆنەپەرستە بەکرێ گیراوەکاندا کەوتبوونە تالانو رفاندنی خێرو داهاتی لەبن نەهاتووی وولاتەکەمان .

لەگەل هەموو ئەمانەشدا ، بیرەوەری جەژنەکانو ئاهەنگ گێڕانی ئەمسال جیاوازیەکی تەواوی هەیە لەگەل سالانی رابردوودا ، ئەویش بریتیە لەوەی کە ئاهەنگەکانی ئەمسالمان لەگەل ئاهەنگی تێکڕای گەلی عیراق بە بۆنەی هەفتەی « قادسیەی صدام » یەك دەگرنەوە ، ئەو هەفتەیەی تەرخان کراوە بۆ جەنگی ڕەوامانو سەرکەوتنمان بەسەر رژێمی ئێرانی دوژمنو گوناهبارو کۆنەپەرست ، ئەو رژێمەی کە شەرێکی ناڕەوای دژی گەلی عیراقو وولاتە خۆشەویستەکەمانی بەرپا کردووە .

ئێستایش لە کاتێکدا کە تێکڕای گەلی عیراقمان لەم ئاهەنگەدا هاوبەشی دەکات ؛ لە هەمان کاتدا پالەوانانەو بۆ سالی سێهەم بەرامبەر شەڕێکی توندوتیژ بۆتەوە دژی فارسە رەگەز پەرستە نەفامەکان ..

- سەرنووسەر -

# چەندین بۆنەی مەزنە

سەرکەوتنی سوپای ئازاشمان لەکەرتی عەمەلیاتی عەسکەری ناوچەی شیبیم، پارێزگای میساندا ، هەموو هیواو ئاواتە چەپەڵەکانی نێو مێشکە بۆگەنەکەی خومەینی و سوپا بەزیوەکەیو پاسدارە ناموسڵمانەکانی و دۆستە هاوبەشەکانی لەشەڕو دوژمنکاریدا وەکو (حافزی) بەدیووم و (قەزافی) شێتو زایۆنیزمی تێك شکاند ..

ئەو سێ بەرەیە دوژمنکارە ، بێ شەرمانە گرەوێکی سێ قۆڵیان بەست ، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ڕژێمە کۆنەپەرستەکەی ئێران و شەڕی دوژمنکاری و گوناهباریان بۆسەر عیراقی سەربەستمان بە ئامانجی تەگەرە خستنە پێش پرۆژە گەورەکانی پەرەپێدان لە ناوەوەی وڵاتی عیراقدا ، هەروەها بۆ ئەوەی عیراق نەتوانێ بە ئەرکە نیشتمانی و نەتەوەییەکانی خۆی هەڵسێ لەسەر ئاستی عەرەبی و جیهانیدا .. بەڵام دەبێ ئەوە بزانن کە بەشییان تەنها پەشیمانی و ڕووڕەشی بووەو دەبێ . چونکە لە عیراقدا گەلێکی پاڵەوان هەیەو سەرکردەکەی سەرۆکێکی ئازاو بەتواناو سوارچاك و لێهاتووەو تێکۆشەرێکی بەجەرگەو دنیا دیدەیەو لەناو کۆمەڵانی گەلەوە هاتۆتە کایەوە ، هەربۆیەشە گەلەکەی خۆی خۆش دەوێ ، هەربۆیەشە صدام حسین لای ئەو گەلە بۆتە نیشانەی ئازایەتی و پاڵەوانیەتی لەوەستاندا بەرەو ڕووی دوژمنە نەزانەکانی ..

شۆڕشی (17 — 30) ی تەموز ئابووری وڵاتەکەمانی لەژێر دەسەڵاتی مۆنۆپۆلە بێگانەکان ڕزگار کرد ، وە لەپێشەوەی هەموویشیانەوە سامانە نەوتیەکەمان بوو ، بەمەیش دەستێکی توندی لە مۆنۆپۆلەکانی جیهانی وەشاندو توانی ئەو ڕێگەیان لێ ببڕێ کە بەدرێژایی چەندین ساڵ سامان و داهاتی وڵاتەکەمانیان تاڵان دەکردو دەیان خستە گیرفانی خۆیانەوە ، هەرئەوەیش وای کرد کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکان و دایەرە سەرمایەداری و ئیمپریالیەکان کە لە دەورو بەریدا دەخولێنەوە بەگوڕ ڕووبکەنە مەیدانی پیلان گێڕان و نەخشەکێشان بۆ ئەوەی تەگەرە بخەنە پێش ڕێڕەوی شۆڕش و دەستکەوتەکانی گەلی عیراق لەناوبەرن ، لە ڕێگەی پشتگیری کردن و هاندانی تاقم و دەستە لاوازو کۆنەپەرستەکانیەوە ، بۆ نانەوەی ئاگری فیتنەو تایەفەگەری و خوڵقاندنی کێشەی نەتەوایەتی و تێکدانی باری ئابووری وڵات .

بەڵام گەل و شۆڕش و حزبە سەرکردەکەمان هەمووکاتێ بە توندی لەڕووی نۆکەراندا وەستاون و هەمووبوارێکی لەکیس داون کە پەنیازییەوە بووبن ، تا بۆ دواجار پەنایان بردە بەر ڕژێمی تەڵەکەباز ئەو ڕژێمەی کە دایەرە ئیمپریالی و عەرەبە کۆنەپەرستەکان کە هەردوو ڕژێمی سوریاو لیبیا نموونەیانن ، وایان بۆ دایە قەڵەم کە عیراق پارووییەکی هاسانەو زوو بەزوو بۆیان قووت دەدرێ ..

ئیتر شەڕە دوژمنکاری و زۆرداریەکەیانیان بەسەر وڵاتەکەماندا سەپاند .. بەڵام بەردەوامی شەڕو فراوان بوونی ، بۆ ئەوان و هەموو جیهانی سەلماند کەوا سوپا نەبەزەکەی عیراق و گەلە پاڵەوانەکەی هەمووکاتێ لە چەك و جبەخانەی زۆرو ماڵ و سامان و ئادەمیزادی زۆرو لەژمارە نەهاتوو بەهێزترە کە ئەوان خۆیانیان پێ هەڵ دەکێشاو لاف

سەرکەوتنیان پێیەوە لێ دەدا .. هەربۆیەش شەڕ بۆ گەلانی ئێران بووە دەردێکی کوشندەو لە ئەنجامیشدا لەسەرتا سەری ئێراندا برسیەتی و نەخۆشی بڵاوبووەوەو ڕۆڵەکانی بەرەو ڕووی چەوسانەوەو دەربەدەری و هەلاتنی بەکۆمەڵ بوونەوە بۆ دەرەوەی وولات ، لەتەك هەزاران کوژراو بریندار لە هەموو بەرەکانی شەڕدا ..

گەلی کوردیشمان کە ئیمرۆ ئاهەنگ دەگێڕێ بە بوونەی جەژنەکانی ئادارو هەفتەی قادسیەی صدام ، پەیمان دووپات دەکاتەوە بۆ سەرکردەی کاروان و پاڵەوانی رزگارکەری نەتەوە سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین کە هەمیشە چاوێکی نەترووکاوو دەستێکی ئەمیندار بێت بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی شۆڕش و زیاتر چەسپاندنیان و بەتین کردنی بەرەکانی شەڕ بەهێزی چەکدار ، بۆ ئەوەی دژی دوژمنە تەڵەکەبازو کۆنەپەرستەکان بوەستن ، تاوەکو چۆکدا دەداو باوەڕ بە مافە ڕەواکانمان دەهێنێ لەخاك و ئاودا .

**ئیتر رۆژی ئەوە هاتووە کە ئەژدەهاکی ئیمرۆی ئێران ؛ واتە تەڵەکە بازەکەی قوم و تاران بەدەستی سەربازەکانی صدام حسین سەری بپلیشێتەوە ، هەروەك چۆن کاوەی ئاسنگەرو هاوپەیمانەکانی لە زوڵم لێکراوو چەوساوەکان دوێنێ سەری ئەژدەهاکی خوێنمژیان پلیشانەوە ، بۆ ئەوەی بۆیان بێتەبەپەند ئەگەرچی زاڵم و خوێنمژەکانی میللەت سوود لەپەندی رۆژگارو مێژوو وەرناگرن .**

ئیمرۆش کە شۆڕش بەگەرمیەوە رووی کردۆتە مەیدانی بنیاتنانی پاشە رۆژێکی گەشەدار بۆ مرۆڤی عیراقی و دوبارە دامەزراندنەوەی کۆمەڵ لەسەر بنەرەتێکی داد پەروەرانەی کۆمەلایەتی و بەیەك چاو ڕوانینە هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵ و بنیاتنان و بەهێزکردنی یەکیەتی نیشتمانی و چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد ؛ ئەوە ئیتر هەموو ئاواتەکانی ئیمپریالیزم و پاڵپشتەکانی لە تاقمە گومڕا لێکراوەکان لە ناوچەی کوردستانی خاوەنی خودموختاری دا پووچەڵ دەبێتەوە ، ئەوانەی کە رژێمە رەگەز پەرستەکەی تاران و حاکمەکانی دیمەشق و تەرابلووس پشتگیریان دەکەن بۆ ئەوەی پیلان بگێڕن و ئاشتی و هێمنی ناوچەکەمان بشێوێنن و رێگە لە گەشەسەندن و پێشکەوتنی هەرێمی کوردوستان بگرن

چونکە ئەوان حەز بەوە ناکەن و لییان خۆش نایەت هەرێمی کوردوستان پێش بکەوێت و لەوەش دەترسن نەوەك تاقیکردنەوەی خودموختاری (حوکمی زاتی) عیراق تەشەنە بکات و بەرەو کوردو ستانی ئێران پەل بهاوێت و گیانی

نیشتمانی و نەتەوایەتی وەبەر ڕۆڵەکانی گەلی ئێراندا بکات و بێتە ئەنجامی ڕاپەڕینێکی گەورەو ڕۆڵەی کەمە نەتەوایەتیەکانی ئێرانیش هەلبستن و داوای ماف خۆیانیان بکەن و ، سنوورێك بۆ ئەو بارە نالەبارە دابنێن کە گەلی کوردو گەلانی تری ئێران تێی کەوتوون و بۆ ئەوەی رزگاریان ببێت لە کوشتنی بەکۆمەڵ و کۆتایی هێنان بە یاسای دەمکوت کردنەوەی داوا کارانی ماف نەتەوایەتی کە ئیمرۆ لە ئێراندا کاری پێدەکرێ لەژێر سایەی رژێمی خومەینی دەست بڕو تەڵەکەباز .

بەلام با ئەژدەهاکە خلەفاوەکەی تازەی ئێران ئەوە چاك بزانێ کە چەند بەهەڵەدا چووە ، گەر بەزین و بەرباد بوونی سوپاکەی لە جەنگی قادسیەی (صدام حسین)دا ، بە سەرکەوتن بزانێت ، هەر ئەو بەهەڵەدا چوون و خەڵەتانەیشی وای کردووە بەناچاری ناوی ئایاتی قورئانی و یارو یاوەرەکانی پێغەمبەر (د . خ) لە هێرشە سەرنەکەوتووەکانی بنێت ، لەکاتێکدا کە ئەوان دورن لەو تاوان و شێواندنی ڕووی راستی ئایینی ئیسلامی و قورئانی پیرۆز ، دەبا حاکمەکانی تاران ئەوە باش بزانن کە بەزینی یەکجارییان شتێکە هەرگیز کێشەی لەسەر ناکرێ و بێشك سەرکەوتنیش هەر بۆ ئیمە دەبێت ..

●

# کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی

## بەبۆنەی تێپەڕبوونی «٩» ساڵەوە بەسەر جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمیدا بۆکوردستان

بەبۆنەی تێپەڕبوونی نۆ ساڵ بەسەر جێبەجێ کردنی یاسای ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد لە کوردستانی عیراقدا ، بەڕێزان هەڤاڵ «سعدي مهدي صالح» ئەندامی سەرکرایەتی هەریمی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست رازگری نووسینگەی ڕێکخستنی باکوورو مامۆستا «احمد عبدالقادر نەقشبەندی» سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانان و مامۆستا «جمال حاجی شەریف حوسێن» سەرۆکی ئەنجومەنی راپەڕاندن بەشداری کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەگەرییان کرد سەر لە سبەینەی ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی 1983/3/9 کە لە هۆڵی ئەنجومەنی یاسادانان ڕێکخراو نوێنەرانی ڕۆژنامەو گۆڤارو ئاژانسی دەنگوباسی تێدا ئامادەبوون .

ئەم بەڕێزانە وەڵامی پرسیارە بەسوودە بەجێیەکانیان دایەوەو سەبارەت بە بارو دۆخی ناوچەی کوردستان و باری عیراق و جەنگە ڕەواکەمان دژی دوژمنی فارسی رەگەز پەرست دوان و زۆر شتی گرنگیان خستە ڕوو دەربارەی ئەو پرۆژەو خزمەتگوزاریانەی پێشکەش بە هاووڵاتیانی ناوچە کراون و هەروەها باری کورد لە وڵاتەکانی دەوروبەر ، بە تایبەتی باری

**بەڕێز سعدی مهدی صالح :**

پارتی بەعسی سۆشیالیست وشۆڕشەکەی گەلی کوردیان بەمافی ڕەوای خۆی گەیاند .

---

**بەڕێز عبدالقادر احمد نەقشبەندی :**

کورد لە عیراقدا خاوەنی ئۆتۆنۆمی یەو لە ئێرانیشدا قەلاچۆ دەکرێ .

---

**بەڕێز جمال حاجی شریف :**

بازی ئابووری وکۆمەلایەتی و ڕۆشنبیریی گەلی کورد مان لە عێراقی شۆڕشدا ، بەردەوام لەگە شەسە ندندایە .



کورد لە ئێران و سووریادا ، ئەو پرسیارانەش لە لایەن رۆژنامەو گۆڤارەکان و دەزگا راگەیاندنەکـان ئاراستـە کرابـوون ، وەك رۆژنامەی «الثورة» و «الجمهوریـة» «العراق» و «هـاوکاری» و گۆڤاری «کاروان» و «ئۆتۆنۆمی» و ئیستگەی کوردی و ئاژانسی دەنگوباسی عیراق و .. هتد .

کۆنگرەکە زۆر بە رێك و پێکی بەستراو پتر لەسێ سعاتی خایاند . لە سەرەتادا مامۆستا «احمد عبدالقادر نەقشبەندی» بەخێرهاتنی میوانەکان و رۆژنامەنووسەکانی کردو خۆشحا لێ خۆی بەرامبەر یادی نۆیەمی ئۆتۆنۆمی و پێشکەوتنی ناوچەی کوردستان لەهەموو روویکەوە دەربڕی و بـاسی ئەو کـۆسپ و تەگەرانەی کرد کە هاتنە پێش کاروانی ئۆتۆنۆمی و چۆنیەتی زاڵ

بوونی گەلی کوردو گشت خەڵکی ناوچەی کوردستان بـەسەر دوژمن و ئەو گیروگرفتانەی هاتنە پێش کاروانەکەی ، هەروەها لە بەخێر هاتنەکـەی بۆ بـەشداربـووەکان ، بـاسی پاڵپشتی و یارمەتی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست و شۆڕشی 17 — 30 تەمموزو سەرۆکی فەرماندە هەڤاڵ تێکۆشەر «صدام حسین» بۆ گەلی کورد لە عیراقدا کرد .

دووای بە خێرهاتنەکە ، پرسیارەکان یەك لە دووای یەك خوێندرانەوەو ئاراستە کران و یەکەم پرسیار لە لایەن ئاژانسی دەنگوباسی عیراق و گۆڤاری «الفباء» دا ئاراستەی هەڤاڵ «سعدی مهدی صالح» کرا دەربـارەی بایـەخدانی پارتی بەعسی بە ناوچـەی ئۆتـۆنۆمی و جێبـەجێکردنی یاسای ئۆتۆنۆمی .. هتد ، ئەمەش کورتەی وەڵامـەکەی هەڤاڵ «سعدی مهدی صالح» ە :

پـارتی بەعسی عـەرەبی سـۆشیـالیست لە سـەرەتـای دامەزراندنیدا بڕوایەکی بێ سنووری بە ماڤی گەلان هەبوو ، بڕوای بە برایەتی و دۆستایەتی و خەباتی هاوبەشی عـەرەب و کوردو مافە رەواکانی گەلی کورد لە عیراقدا هەبوو . بـۆ ئەم راستییەش گەلێ بەلگە بـە دەستەوە هـەن و پێویست نـاکات باسیان بکەین و بیان ژمێرین ، چونکە ئەوەندە زۆرن و لە لایەن هەموو هاووڵاتیە نیشتمان پەروەرەکان و رۆڵە بەشەرەفەکانی ئەم وولاتە خۆشەویستە روونە و ئاشکرایە و چارەسـەرکردنی کێشەی کورد کارێکی سەرەکی شۆڕشی 17 — 30ی تەمموز

بوو . بۆیە پارتی بەعس و حکومەتی شۆڕشی 17 — 30ی تەمموز دووای تێپەڕ بوونی نزیکەی سالّ و نیوێك بەسەر بەرپا بوونی شۆڕش بە یاننامەی 11ی ئاداری ساڵی 1970ی دەرخست ، ئەو بەیانەی هەموو مافە رەواکانی گەلی کوردی سەلماندو نەخشەی جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بە درێژایی چوار ساڵی داناو لە رۆژی 11ی ئاداری سـاڵی 1974دا یاسـای ئۆتـۆنۆمی دەرخست و ئۆتۆنۆمی ی بۆ ناوچەی کوردستان هێنایەدی ، هەر چەندە هێندێك لە بەکرێگیراوەکانی ئیمپریالیزم نەك هەولیاندا بۆ

ئەوەی دووا بخرێت ، بەڵکو نەیان دەویست بـە هیچ جـۆرێك جێبەجێ بکرێت و کورد بە مافە رەواکانی خۆی بگات . بەلام شۆڕشی پارتی پێشڕەو پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست هەر لە سەر پەیمانەکەی خۆی سوور بوو تۆزقاڵێك لێی لانەدا و لە رۆژی 11ی ئاداری ساڵی 1970 هەر وەکو باسمان کرد دانی بە مـاڤی تـەواوی گـەلی کـوردی نـاو دەزگـای دەستـووری بـۆ دامەزراند ، باشترین و چالاکترین مرۆڤ لە خەڵکی کوردستان



بۆ ئەندامیەتی‌و کارکردن لە هەر دوو ئەنجومەن ، ئەنجومەنی پاسادانان‌و ئەنجومەنی راپەڕاندنی هەڵبژارد .

ئا بەم جۆرە گەلی کورد بە مافە رەواکانی خۆی گەیشت‌و ئەگەر هەر کەم‌و کورتیەك روویدا بێت بە شتێکی سەیری نەبینن ، چونکی هێنانە دی‌ی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان تاقی کردنەوەیێکی نوێ بوو . هیچ پارتێك پێش پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست ئەو دەسکەوتووەی بۆ کورد وەرنەگرت ، هیچ حکومەتێك پێش حکومەتی پارتی بەعسی‌و شۆڕشی 17ی تەمموز مافی ئۆتۆنۆمی بە کورد نەدابوو . جگە لە مەش ئەو وولاتانەی کە کوردی لێ دەژین وەك ئێران مافی ئۆتۆنۆمیان نەدا بۆ کورد وتا ئێستاش نەیانداوە ، سەرەڕای ئەوەی کە ئۆتۆنۆمی بۆ کورد بە تاقی کردنەوەیێکی نوێ دەژمێردرێت . هەندێ لە وولاتە دراوسێکانمان وەك ئێران‌و سوریا کەوتنە جموجوولْ‌و پیلان‌گێڕان دژی عیراقی شۆڕش چونکی حکومەتی عیراق مافی ئۆتۆنۆمی‌ی دا بە گەلی کورد لە عیراقدا . شای ئێران‌و تاقمە بەکرێگیراوەکەی چەند سالێك خەریکی پیلان‌گێڕان بوون دژی عیراق ، دووا بە دووای ئەویش خومەینی خوێنڕێژو جادوگەر پەیڕەوی هەمان سیاسەتی شای کۆنەپەرستی کرد دژی وولاتەکەمان‌و گەلەکەمان . ئەمە لە رۆژ هەلاتی وولاتدا . لە رۆژ ئاواش تاقمی حافز ئەسەد نۆکەری ئەمەریکاو زایۆنیزم‌و ئیمپریالیزمی جیهانی کەوتە جموجوولْ‌و نەخشەکێشان بۆ لێدانی شۆڕشی 17 — 30 تەممووز بۆ ئەم مەبەستە چەند هەنگاوێکی نا وەك بڕینی ئاوی فورات‌و خۆماڵی کردنی خەتی لوولەی نەوت لە سوریاو نەهێشتنی ناردنی نەوت بۆ دەرەوە بە رێگای سوریادا .

**تاقمی تاران‌و دیمەشق نۆکەرانی راستەقینەی ئیمپریالیزم‌و زایۆنیزم ، لە بەر چەند هۆیەك شەوو رۆژ هەوڵدەدەن‌و تێدەکۆشن بۆ لێدانی عیراقمان لەم هۆیانەدا هەر وەکو باسمان‌کرد : دان بە مافی گەلی کورد لە عیراقداو راوەستانی حکومەتی 17 — 30 تەممووز راوەستانێکی ئازایانەو مەردانە دژی زایۆنیزم‌و ئیمپریالیزم .**

لە بەر ئەم هۆیانەو چەند هۆیێکی‌تر زایونیزم‌و ئیمپریالیزم‌و نۆکەرەکانی لە قوم‌و تاران‌و دیمەشق‌و لیبیاو نۆکەری ئەم نۆکەرە بچووکانەش ، کە چەند تاقمێکی بێ گەل‌و خۆفرۆشن ، شەوو رۆژ ، دێن‌و دەچن .. چەك‌و پارە وەردەگرن‌و . پیلان بۆ عیراقی کوردو عەرەب دادەنێن .



هەڤاڵ . «سعدی مهدی صالح» له وەڵامەکەی‌دا باسی دیموکراتیەتی بۆ کورد کرد ، کە چۆن ئەم گەلە دوو مافی سیاسی‌و نەتەوەیی هەیە ، پاشان هاتە سەر خۆفیداکردنی کوردو بەشدار بوونی رۆڵەکانی بە هەزاران له جەنگی قادسیەی صدام‌و خەبات کردنیان دژی دوژمنی رەگەز پەرست چ له بەرەی جەنگ داو چ له کارکردنیان له ریزی سوپای میللی‌دا .. هتد .

ئەوەی شایانی باسە وەڵامە گرنگەکەی هەڤاڵ «سعدي مهدي صالح» پڕ بە پێستی ئەو پرسیارانەی ئاراستەی کرا بوون‌و لێرەدا تەنها ئەوەمان له دەست دێت ئیشارەتی بۆ ببەین‌و بە کورتی باسی بکەین لەبەر چەند هۆیەکی هونەری ناتوانین دەقەکەی بڵاو بکەینەوە .

پاشان بەڕێز احمد عبدالقادر نەقشبەندی سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانان له سەر کێشەی کوردو باری ناوچەی ئۆتۆنۆمی ، گەلێ دوا له وەڵامەکانی‌داو بە تایبەتی له سەر باری کورد له عیراق‌و له ئیران‌داو بەراووردی بارەیان له هەر دوو وولاتدا . ووتی :

گەلی کورد له کوردستانی عیراقدا له بارێکی یەکجار خۆش‌و پڕ له بەختیاری‌و کامەرانی‌دا دەژی‌و بۆ یەکەم جارە له مێژوودا ئۆتۆنۆمی وەردەگرێت و منالەکانی بە سەربەستی بە زوبانی کوردی له قوتابخانەدا دەخوێنن ، جگە له بڵاوکردنەوەو دەرچوونی جۆرەها گۆڤارو رۆژنامەی کوردی و دامەزراندنی گەلێ دەزگای رۆشنبیری بۆ پێشخستنی سەقافەی کوردی ، ئەمەو گەلێ دەسکەوتی تر له عیراقدا ، له ئیرانیش کورد چی هەیە : ئۆتۆنۆمی .. نە .. مافی رۆشنبیری .. نە .. دەزگای رۆشنبیری ئەویش تەنها یەك شت بۆکورد له ئیران‌دا هەیە بگرە له زەمانی شاداو تا ئەمڕۆ ئەویش کوشتن‌و گرتن‌و ئازاردان‌و لەناوبردن‌و له سێدارەدانی رۆڵەکانی کوردە . له شارو دێهات‌و ناوچەکانی کوردستانی ئیران .

دەربارەی بایەخدان بە ناوچەی کوردستان مامۆستا احمد عبدالقادر نەقشبەندی ووتی :

بۆ ئەوەی ئەنجومەنی یاسادانان بە تەواوی له وەزع‌و باری گەل‌و ناوچە بگات . پەیوەندییکی بەهێزو بە تینی بەستووە له گەل جەماوەرانی خەڵکدا له رێگای پێك هێنانی چەند لیژنەیێك کە بریتین له شەش لیژنەی پسپۆری‌ی جۆراو جۆریان هەیەو ناوە ناوە گەشت ئەکەن بۆ شارو دێهاتەکان بۆ پەیوەندی بەستن له گەڵ جەماوەرانی ناوچەکانی کوردستانداو رێکخراوەکان‌و بنکەکانی پارتی بەعسی عەرەبی سوشیالیست .

ئۆتۆنۆمی‌و چالاکی‌ی روشنبیری له ناوچەدا . باری روشنبیری له ناوچەی کوردستاندا ، گەلێ پرسیار دەربارەی ئاراستەکران‌و مامۆستا «جمال حاجی شەریف حوسین» وەلامی دانەوەو ، له وەلامەکەیدا باسی پاڵپشتی میریی کرد بۆ پێشخستنی روشنبیریی کوردی‌و چالاکی ئەمینداریەتی گشتی روشنبیری‌و لاوانی دەرخست کە ئەو ئەمینداریەتە تەقەلایەکی بێ ووچان دەدات بۆ بڵاوکردنەوەی ئەدەبی کوردی‌و بایەخدان بە کە له پووری نەتەوەی‌کورد ، مامۆستا «جمال حاجی شریف» سەرۆکی ئەنجومەنی راپەراندن ووتی :

١ - ئەمینداریەتی گشتی روشنبیری‌و لاوان له سالانی رابووردوودا دەستی یارمەتی بۆ نووسەرانی کورد درێژکردو یارمەتی له چابدانی 20 کتێبی بە زوبانی کوردی

کردووە جگەلە لە ئەستۆگرتنی لە چاپدانی 7 کتێبی تر ، ئەمە تەنها لە ساڵی 1982 کرا ، ئەو کتێبانەی لە چاپ دران گەلێ جۆرە کتێبی وەك : شیعرو چیرۆك و شانۆگەری و فۆلکلۆرو لێکۆڵینەوەو .. هتد .

2 - ئەمینداریەتی رۆشنبیری و لاوان نەك هەر یارمەتیدانی لە چاپدانی دەیەها کتێبی کوردیی خستە سەر ئەستۆی خۆی بەڵکو یارمەتی نووسەرانی کوردی لەگەڵ رووەوە داوە وەك کڕینی سەدەها کتێبی کوردی لەم نووسەرانە .

3 - بۆ پێشخستنی چالاکی رۆشنبیری و بردنی چالاکی هونەری و ئەدەبی بۆپێشەوە ، ئەمینداریەتی رۆشنبیری ، گەلێ رێگای تری هەیە بۆ ئەم مەبەستە وەك ئاهەنگ گێران و پێك هێنانی کۆڕو ، هتد . لە ساڵی 1982 پتر لە 20 کۆڕو فیستیڤاڵی ، ئەدەبی و هونەریی پێك هێناو یەکێك لە چالاکی یە گەورەکانی ئەم ئەمینداریەتە فیستیڤاڵی دووەمی چیرۆکی کوردی بوو کە سێ رۆژی خایاندو زیاتر لە 80 نووسەری کورد بەشدارییان لێ کرد .

4 - لە ساڵی 1982 ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری و لاوان پتر لە 10 ئاهەنگی گۆرانی و مۆسیقی لە سەرانسەری ناوچەی ئۆتۆنۆمی گێرا .

5 - ئەمینداریەتی رۆشنبیری و لاوان بایەخێکی تایبەتی بە هونەری تەشکیلی و هونەرمەندە تەشکیلی یەکان داوەو لە ساڵی 1982 پتر لە 15 پێشانگای لە ناوچەدا کردەوە .

6 - لە ساڵی 1982 ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری و لاوان چالاکی یەکی فراوانی نواند بۆ روون کردنەوەی سیاسەتی دەوڵەت دەربارەی گەلێ رووداو بە درۆ خستنی فارسە رەگەز پەرستەکان . بۆ ئەم مەبەستە پتر لە 15 قافیلەی ئیعلامی لە هەموو مانگێکدا بۆ ناوچەکانی کوردستان رەوانە دەکرا ، ئەم قافیلە ئیعلامیانە وێنەی سەرۆکی فەرماندەو پۆستەری سیاسی و جۆرەها کتێبی سیاسیان بلاو دەکردەوە .

## «کاروان» رووداوێکی رۆشنبیریی گرنگە

بەڕێز مامۆستا «جمال حاجی شریف» سەرۆکی ئەنجوومەنی راپەڕاندن هاتە سەر باسی گۆڤاری «کاروان» گۆڤاری ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری و لاوان ووتی :



ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری و لاوان بە رێك و پێکی ئەم گۆڤارە بلاو دەکاتەوە ، دەرچوونی ئەم گۆڤارەش بە رووداوێکی رۆشنبیریی گرنگ دەژمێرێت . هەر وەها ئیشارەتی دا بە «چاپخانەی رۆشنبیری ، و دەوری ئەم چاپخانەیە لە پێشخستنی رۆشنبیری کوردیدا لە دووا رۆژداو ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری و لاوان بیر لە دەرچوون و بلاوکردنەوەی رۆژنامەیێکی هەفتانە بە زمانی کوردی دەکات دووای بەکار هێنانی چاپخانەکە

هەروەها بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی راپەڕاندن جگە لە لایەنی رۆشنبیری ، وەلامی گەلێ پرسیاری تری دایەوە کە سەبارەت بە باری سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی ی کوردستاندا ئاراستەی کران ، بەتایبەتی سەبارەت بەو دەسکەوتانەی کە شۆڕشی 17 — 30 تەمووز بۆ خەڵکی ناوچەکەی بەدی هێناون و ئیشارەتی بە چەندین پرۆژەدا لەم بوارەدا کە لە ساڵانی پێشوودا جێبەجێ کراون .



# هەفتەی قادسیەی صدام وجەژنەكانی ئازار لە چەند وت وویژیكدا لەگەڵ

## بەڕیز محمد امین محمد احمد
ئەمینداری گشتی ی رۆشنبیری ولاوان

## دوكتۆر خسرو غنی شافی
سەرۆكی زانكۆی صلاح الدین

## بەڕیز یحیی محمد رشید جاف
پاریزگاری هەولیر

## بەڕیز اسماعیل عبدالكریم بەرزنجی
ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی

بەبۆنەی هەفتەی قادسیەی صدامو جەژنەكانی ئازارەوە ، گۆڤاری ، كاروان ، مان چووە دیدەنی ی بەریز محمد امین محمد احمد ئەمینداری گشتی ی رۆشنبیری و لاوان ، دوكتۆر خسرو غني شالی سەرۆكی زانكۆی صلاح الدین ، بەریز یحي محمد رشید جاف پاریزگاری هەولیر ، بەریز اسماعیل عبدالكریم بەرزنجی ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی و داخوازی ی لیكردن كە بەم بۆنەیەوە بۆ خوینەرانی گۆڤارەكەمان بدوین . ئیمەش بە سوپاسەوە وا وتەكانیان بۆ خوینەرانی ئازیزمان بلاو دەكەینەوە .



**محمد امين محمد احمد :**

**پرۆگرامێکی فراوانو پڕ بە پێستی پارێزگاکان گشتیان لە سەری دەڕۆن ، بۆ ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی جەژنەکانی ئادارو نەورۆزو قادسیەی صدامەوە . ئەوەی شایانی باسە ئـــەم پرۆگرامە بریتی‌یە لە نەخشە کێشانێکی فراوان زۆربەی زۆری جەماوەرانی خەلك بە تایبەتی لـــە پارێزگاکانی ناوچـــەی ئۆتۆنۆمی تێدا بەشدار دەبن ، ئاهەنگ گێڕانیش بە بۆنـــەی قادسیەی صدام تەنها یەك هەفتە ناخایەنێ وەك هەندێ کەس بە هەلە بۆ ی چوون ، بەلکو نزیکەی دوو هەفتە دەخایەنێو لە 21 ی ئادار دەست پێ دەکاتو لە 6ی نیسانیشدا کۆتـــایی پێ دێت . ئا بەم جۆرە ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی قادسیەی صدام دوو هەفتە دەخایەنێ .**

وە بۆ ئەوەی بەم بۆنە پیرۆزانە ئاهەنگ گێڕان سەرکەوتوبێتو جیگای رەزامـــەندی دانیشـــتووانی ناوچـــەی کوردستان بێت ئەمێندارێتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان یەکەوســـەر سەرپەرشتی‌ی دەزگاکانی راگەیاندنەکانی پارێزگاکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی دەکاتو گەلێ فەرمانی بە جێو کاریگەر ، دراوەتـــە بەڕێوەبەرایەتیەکانی رۆشنبیری جەماوەری‌و یەکێتی‌یەکانی لاوان بۆ سوود وەرگرتن لە پێناو ئامادە بوونی جـــەماوەرو بەشداری کردنیان لەم ئاهەنگانە . ئەوەی گومانی تیا نی‌یـــە ئەم مانگە بە هەموو جەژنەکانو ڕووداوەکانی مێژوویی شوێنێکی تایبەتی هەیە لای گەلی کوردی قارەمانو نەبەز بە تایبـــەتی‌و لە لایەن گشت جەماوەرانی عیراق بە گشتی . وە بۆئـــەوەی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی جەژنەکانی ئادارو نەورۆزو قادسیەی صدام بە رێکوپێکی ئەنجام بدرێتو جێگەی رەزامـــەندی گەلەکەمان بێت هەر وەکو ووتمو جگە لەوەی باسم کـــرد . لێژنەیەکی بالاو تایبەت بۆ سەرپەرشتی کردنی ئـەم ئاهەنگو جەژنانە پێك هاتووەو ئەندامەکانی بەڕێزان : ســــەرۆکی ئەنجومەنی راپەراندنو ئەمینداری گشتی روشنبیری‌و لاوانو سکرتێری شوعبەی هەولێرو لێپرسراوی نووسینگەی پێشەیی پارتی بەعسی عەرەبی لە شوعبەدا . جگە لەم لێژنەیەش چەند لێژنەیێکی‌تر هەن کە سەر بە لێژنەی بالان لە پارێزگـــاکـــانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی‌دا .

**بایەخدان بە جەژنە نەتەوایەتیەکانی گەلی کوردمان لـــە لایەن میری شۆڕش تەعبیرە لە عەقیدە بەرزەکـــەی پـــارتی سەرکردە ، پارتی بەعسی عەرەبی ســـۆشیالیست ، ئـــەم بایەخدانەش سال بە دووای سال زیاتر دەبێو پـــەرەی پێ دەدرێت ، جگە لەمەش بایەخدانو پەرەپێدان بە مافە نەتەوەیە رەواکانی گەلی کورد لە گشت ڕوویەکەوە لە لایەن حکومـــــەتی شۆڕشی 17ـــ30 تەمموزو پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست هەر بەردەوامەو بێ راوەستانە .**

لەم بڕوایەش دام کە گەلی کورد لە عیراقدا ئەمڕۆ زیاتـــر لە هـــەموو کاتێـــك لـــە دەوری ئـــالای شـــۆڕشی 17 ـــ 30 تەمموز کۆ بووتەوەو ئامادەیی خۆی پێشان دەدات بۆ پاراستنی دەستکەوتووەکانی‌و پشتیگیری کردنی پارتی بەعسو میری شۆرشگێر لە جەنگی رەوامان دژی کاربەدەستە بە کرێگیراوەکانی تاران . ئەوەی گەلی کوردیشی گەیاندە ئەم قەناعەتە نـــەك دروشمو ووشەو قسەی بریقەدار بووە ، بەلـــکو تـــاقی کردنـــەوەیێکی یەکجـــــار دەولەمەندبوو کـــە لـــە ســـالانی دووایی‌دا گەلی کورد بە تەواوی دۆستو دوژمنی خۆی ناسی. دۆستەکەی ئەو کەسەیە کە بڕوای هەیە بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردو بە گشت مافە نەتەوەیە رەوایەکانی . دوژمنیش ئەوەیە کـــە

قناره بۆ رۆڵەکانی قیت دەکاتەوەو لە پەنای ئاینی ئیسلامی پیرۆزەوە مافە نەتەوایەتیەکانی کورد زەفت دەکاو بەند دەکاو راوی دەنێ . بەڵی گەلی کورد گەیشتە ئەو قەناعەتە کە بەعسی تێکۆشەر دۆستێتیو تاقمە رەگەز پەرستییەکەی تارانو دۆستە خائینەکانی ئەم تاقمە دوژمنییەتیو زوحاکی سەردەمی بیستەمین .

**ئەم ساڵەش زیاتر لە ساڵەکانی پێشو . ئاهەنگ گێران بە بۆنەی ئادارو نەورۆز تامێکی تایبەتی هەیە بە تایبەتی دووای شکاندنی گەورەترین هێرشی دوژمنی فارسە رەگەز پەرست کە هێنایە سەر سنووری رۆژ هەڵاتمان لە ناوچەی ـ الشیب ـدا . ئەو خەونە پووچەڵەی کە دەیبینی بۆ ئەوەی وولاتمان داگیر بکات نەهاتە دی ، سەرەڕای ئەمەش گشت هێزەکانی لە ناوچوونو ئەوانەی رزگاریش بوون بە دیل گیران .**

**ئینجا هیواداین گەلەکەمان رۆڵێکی باش ببینێ لە ئاهەنگەکانی ئادارو نەورۆزو قادسیەی صدامداو هێزە چەکدارەکانیشمان هەر سەرکەوتووبن تاکو رژێمی تارانی بەکرێگیراو دەڕووخێو لەناو دەچی .**



**خسرو غني شالی**

بەر لە بڵاوکردنەوەو دەرخستنی بەیاننامەی 11ی ئاداری ساڵی 1970و جێبەجێ کردنی یاسای ئۆتۆنۆمی لە ساڵی 1974دا ، گەلی کوردی قارەمانو نەبەز تەنها یەك جەژنی رەسەنی نەتەوایەتی هەبوو . ئەویش جەژنی نەورۆزی پیرۆزبوو . ئەم جەژنەش ، خەڵکی کوردستان چ لە شارو چ لە لادێدا بە نهێنی دوور لە چاودێری جاندرمەکانو سیخوڕەکانی میری ئاهەنگیان بۆ دەگێڕا . گەلێ جاریش زەربیەی ئاهەنگێرانی دەدا ، گەلێ لە رۆڵەو لاوە دڵسۆزەکانی تووش گرتنو راکردنو دەربەدەریو . بگرە هەتا لە سێدارەدانو کوشتنیش دەبوون بەڵام میریی شۆڕش 17 – 30ی تەممووزی ساڵی 1968 بە سەرکردایەتی پارتی پێشڕەو پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستو سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین دووای خەباتێکی بێ ووچانو سەختو دوورو درێژی پڕ لە قوربانی توانی نەك هەر نەورۆز بکات بە جەژنێکی ئاشکراو رەسمی بۆ گەلی عیراق بە کوردو عەرەبییەوە ، بەڵکو مانگی ئادار بکاتە جەژنو هەموو رۆژەکانی ئەم مانگەی بکاتە شاییو زەماوەندو فیستیڤال . لەم جەژنانە ، جەژنی 11 ئاداری نەمرە ، واتە جەژنی گەیشتنی گەلی کورد لە کوردستانی عیراقدا بە گشت مافە نەتەوەییەکانیو لە پێش هەموویاندا ، مافی ئۆتۆنۆمی لە ناوچەی کوردستان دا .

بەڵێ ، رۆژی 11ی مارتی 1970و رۆژی 11مارتی ساڵی 1974 . بە پیتی زێڕین لە مێژووی کوردا دەنووسرێن ، بۆیە گەلەکەمان هەتا هەتایە بە خۆشو شادی ئاهەنگ بۆ ئەم جەژنە دەگێڕیو مافە نەتەوایەتیەکانی بە خوێن دەپارێزێ ، ئەو مافانەی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست بۆی وەرگرتو دەزگاو یاسای بۆ چەسپاندنیو سوود لێ وەرگرتنی دانا .

لەبەر ئەمە ، مرۆڤی کورد لە وولاتانی ترو لە دەرەوەی عیراق بە گشتی روویان لە عیراق کردووەو بە چاوێکی پڕ لە رێزو خۆشەویستی ئەڕواننە وولاتی عیراقو گەلو حکومەتەکەی . وە ئەوەی گومانی تێدانییە ، باری گەلی کورد لە عیراقدا ئەبێتە هۆی راپەڕینی هەموو گەلی کورد لە دەرەوەی وولاتدا چاکترین بەڵگەش بۆ ئەم راستییە خەباتی گەلی کوردە لە ئیراندا دژی تاقمی خومەینیی خوێنمژ .

**لە کۆتاییدا ، بە بۆنەی جەژنی ئادارو نەورۆزو قادسیەی صدامەوە ، پەیمان نوێ دەکەمەوە بۆ سەرکردایەتی شۆڕشو هەڤاڵی تێکۆشەر صدام حسین کە هەتا دووا دلوپ لە خوێنمان خەبات بکەین لە پێناوی سەرکەوتن بەسەر دوژمنانی وولاتەکەمانو شکاندنی پیلانەکانی ئیمپریالیزمو بە کرێگیراوەکانی قومو تاران .**



یحیا جاف :

**بەیاننامەی 11ی ئاداری مێژوویی ، کە میری شۆڕش 17ـ30 تەمموزی تێکۆشەر بەر لە 13 ساڵدا ، واتە لە ڕۆژی 11ی مارتی ساڵ 1970 دا دەریخست، دۆستایەتیو برایەتی‌ی نێوان هەردوو گەلی خەباتگێڕو کۆڵنەدەر ، لە سەر بنچینەو بناغەییکی نوویێو بە هێزو توند چەسپاند ، لەم بەیاننامەیە دا ، میری‌ی شۆڕشگێڕو نیشتمانپەروەر دانی نا بە مافە نەتەوەی‌یە ڕەواکانی گەلی کورد لە عیراقدا . ئەو گەلەی بۆ یەکەم جار لە مێژوودا سەربەستانە تامو چێژی لە مافە ڕەواکانی خۆی وەرگرت . ئەو مافانەی دەیەها یاخود سەدەها ساڵ خەباتو قوربانییێکی یەکجار زۆری لە پێناودا پێشکەش کردو ئاواتە هەرە مەزنەکەی گەلی کوردمان لە 11ی مارتی ساڵی 1970 دا هاتە دی کە میری‌ی شۆڕشگێڕ بە سەر کردایەتی پارتی بەعس سۆشیالیستی نەبەز سەبارەت بە گەل کورد لە سەر پەیمانەکەی خۆی سووڕ بوو جێ‌بەجێ‌ی کردو بە بۆنەی تێپەڕ بوونی چوار ساڵ بەسەر ئەم بەیاننامەیە یاسای ئۆتۆنۆمی‌ی بلاوکردەوەو دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی‌ی دامەزراند وەك ئەنجومەنی یاسادانانو ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنو ئەمینداریتی‌یە گشتی‌یەکان .. هتد . کە لە ڕێگای ئەم دەزگایانە بۆ یەکەم جار لە مێژوودا، گەلی کورد ومارەسەی مافە نەتەوەییە ڕەواکانی خۆی دەکات .**

تا بەم شێوەیە بەرەی گەلی عیراق چەسپاو بە هێزتر بوو ، کوردیش بەتێکڕایی ڕووی کردە میرییەکەی خۆی‌و ئامادەیێکی بێ سنووری نیشاندا لەپێناو پاراستنی مافی نەتەوایەتی‌و گشت دەستکەوتووە مەزنەکانی شۆڕشی 17ـ30 تەمموزی پیرۆز. بەڵێ کورد چ لە عیراقدا چ لە ووڵاتانی تردا دووای تاقی کردنەوەیێکی سەر کەوتووانە بۆی‌ئاشکرا بوو کە میری بەعسی لە جیهانی ئەمڕۆ داو بە درێژایی مێژووی گەلان تەنها دەوڵەتەکە مافی نەتەوەیی دایە گەلی کوردی عیراق‌و گەلێ یاساو دەزگای لە پێناو چەسپاندنو پاراستنی ئەم مافە دامەزراند .

تا لەبەر ڕووناکی ئەم ڕاستی‌یە گەلی کورد هەتا بەرگری لە مافەکانی خۆی‌و بەرگری لە شۆڕشی 17 ـ 30 تەمموز دەکات . ئەمەش لە بیر ناچێ کە تەنها حکومەتی بەعس بوو بۆ یەکەمجار لە مێژوودا ئیعترافی بەگەلی کوردو مافە ڕەواکانی کرد بۆیە دەبینین ، گەلی کوردمان قسەی دوژمنان بە درۆ دەخەن بە تایبەتی ئەو دوژمنانەی بە درۆ بۆ کورد فرمێسك دەرێژن ، کەچی سەری کوردەکان دەبڕنو تێکۆشەرەکانیان لە بەت‌دەدەنو بگرە بە هیچ جۆرێك ئیعتراف بە مافی کورد ناکەنو هیچ دەزگایەکی ڕۆشنبیری یا خۆد ڕۆژنامەیێك بەزوبانی کوردی لە ووڵاتەکانیاندا دەرناچێ .

ئەمە لە لایەکدا ، لە لایەکی ترەوە ، گومان لەوەدا نی‌یە کە ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەر لە شۆڕشی 17 ـ 30 تەمموزدا لە گشت ڕوویێکەوە پاشکەو توو بوو ، نەخوێندەواری‌و نەخۆشی بە تەواوی پەرەیان سەند بوو ، سەرانسەری ناوچەکە هەر لە دێییێکی هەژارو زۆر پاشکەوتوو دەچوو ، بەڵام دووای بەرپا بوونی شۆڕشی 17 ـ 30 تەمموز گەلێ پرۆژەی گرنگ کرایەوە، ئەم پرۆژانە بە تەواوی ڕووی ناوچەکەیان گۆڕی . ئەگەر بهاتایە عیراقمان تووشی ئەم جەنگەی بە کرێ‌گیراوەکانی تارانو قم ، نۆکەرانی ئیمپریالیزمی جیهانی‌و زانیۆنیزمی بۆگەن یاخود دەستی تێکدان لە لایەن ئەو تاقمانەی بازاریان بە کورد گەرم دەکەن نەبوایە ناوچەکە زیاتر پێش دەکەوت‌و گەلی کوردمانیش دەستکەوتی تری وەردەگرت . بەڵام گەلی کورد سەرەڕای ئەمەش توانی مافەکانی خۆی بەرێك‌و پێکی بپارێزی‌و ناوچەکە بەرەو پێش بیات‌و شارستانیەتی بگەیەنێتە دوور ترین شوێن‌و ناوچە . تا بەم جۆرە توانی جیاوازی‌ی نێوان شارو لادێ کەم بکاتەوەو لێکیان نزیك بکاتەوە .

**دەگەڕێمەوەو دەڵێم مانگی مارت یا ئادار لە نێو مانگەکانی ساڵدا شوێنێکی تایبەتی لە دلی گەلی کورددا هەیە ، چونکی لەم مانگەدا بەیاننامە پیرۆزەکەی مارت دەرچوو .. لەم مانگەدا یاسای ئۆتۆنۆمی جێ‌بەجێ کرا .. جگە لەمەش ڕۆژی نەورۆز کە دەکەوێتە ئەم مانگە کرا بە جەژنێکی ڕەسمی نەك هەر بۆ کورد بەلکو بۆ گشت گەلی عیراقەوە .. ئاهەنگ گێڕانی ئەم ساڵمان بە بۆنەی ئادارو نەورۆزەوە تامو بۆیەکی تری هەیە چونکی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی قادسیەی صدامیش هەر دەکەوێتە ئەم مانگەو لە 21 ئادار دا دەست پێ دەکاو ، لێرەدا سەرنج ڕادەکێشم بۆ ڕۆڵی جەماوەری هەولێری قارەمان لەگشت شارو لادێیەکانی پارێزگاداو بەشدار بوونێکی تەواویان لە قادسیەی صدامدا کردووە ، لە ڕێگای چوونە ڕیزی سوپای**

**میللیو بنکەکانیوەو ناردنی سەدەها جەنگاوەری بەشەرەفو کۆلنەدەر بۆ بەرەی شەڕو خەباتکردن دژی کۆنەپەرستو رەگەز پەرستی تارانو قم .. جگە لەمەش جەماوەری هەولێر پوولو دراوێکی یەکجار زۆریان پێشکەش کردووە تاکو عیراق هـەر بەردەوام بێت لە جەنگە رەواکەیدا دژی دوژمنانیو زیاتر لـە 170 هەزار کەسیش تەطوعی کردووە بۆ بەشدار بوون لـە جەنگو دیفاع کردن لە سنوورو خاکی پیرۆزمان . بڕیاری لێ بووردنیش لە کەسانی دوواکەوتوو یا راکردوو لە خزمـەتی سەربازی ، نامەکەی سەرۆك صدام بۆ کـەسو کـارو خێزانەکانیان کارێکی باشی نوانـد لە نێو خەلکەکەداو ، بە هەزاران هاوولاتی سوودیان لێ وەرگرتو روویان کـردە دەوائیری تەجنید بۆ بەشداری کردن لە قادسیەی صدامداو درێژە پێدان بە خەباتو تێکۆشان دژی رەگەز پەرستەکانی قومو تاران دوژمنانی راستەقینەی گەلی کورد .**

---



**اسماعیل عبدالکریم بەرزنجی**

پێش هەموو شتێك بەخێرهاتنێکی گەرمتان لێ دەکەمو بە بۆنەی جەژنەکانی ئادارو نەورۆز پڕ بەدڵ پیرۆزبایی لە هەموو کارگەرانی گۆڤاری «کاروان»ی خۆشەویست دەکەم بەم بۆنە پیرۆزانە . مانگی ئادار ، شوێنی تایبەتی خۆی هدیە لە دڵی گەلی کورد بە تایبەتی لە عیراقدا . چونکە لەم مانگەدا نەك بۆجەژنی نەورۆز ئاهەنگ دەگێڕین بەڵکو زەماوەند بۆجەژنی 11 ئاداریش دەکەین . پتر لە 12 ساڵ ، گەلی کوردو هەمـوو جەمـاوەرانی عیراق ئاهـەنگ بـەم بۆنـە دەگێڕنو پیـرۆز بایی لە یـەکتری دەکەن ، چونکە لە رۆژی 11 ئاداری ساڵی 1970 گەلی کورد بە مافە رەواکـانی خۆی گـەیشت ، حکومـەتی شۆڕشی 17 — 30 تەمووز بەیاننامەی 11 ئـاداری بڵاوکـردەوە ، مافی تـەواوی نەتەوەییدا بە گەلی کوردی تێکۆشەر ، ئەو گەلەی خەباتی کرد بە درێژایی سەدان ساڵو هەزاران شەهیدی پێشکەش کرد لە پێناوی رزگاریو سەربەستیو دیمـوکراتیـەتو ئازادی ، تـا خەباتەکەی سەرکەوتو پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستو سەرکردایەتی هەڤـاڵی تێکۆشـەر کاك صـدام حسین هـەموو مافەکانی ئەو گەلەی سەلماندو دەزگای رەسمیو دەستووریی بۆ چەسپاندنیو پاراستنی دامەزراند .

مانگی ئادار ، مانگێکی پیرۆزە ، چونکە گەلی کورد دوو جەژنی تیایدا هەیە جەژنی ئادارو ئۆتۆنۆمیو جەژنی نەورۆز . مـانگی نەورۆز ، مـانگێکی رەنگینەو سـروشت لەم مانگـەدا یـەکجار جـوانە ، سـەوزە ، پڕە لە گـوڵو گوڵزار ، ئـەوەی جەژنەکانی ئەو ساڵ خۆشتر دەکات ئاهەنگ گێڕانە بە بۆنەی «قادسیەی صدام» کە لە 21 ئادار واتە لە رۆژی نەورۆز دەست پێ دەکات .

لە کۆتاییدا ، بە بۆنەی یـادی جەژنی ئـادارو نەورۆزو قادسیەی صدام دەڵێم : بۆ ئەوەی هەموو رۆژانمان جەژن بێ پێویستە لەسەر رۆڵەکانی گەلی کورد مافە رەوکانیان بپارێزنو لە ژێر ئاڵای پارتی بەعسی هەرەبی سۆشیالیستاو سەرکردایەتی رۆڵەی گەل کاك صدام حسین کۆببنەوەو هەمووماں هەوڵدەین بۆ پتەو کردنو بە هێز کردنی یەکێتی نیشتمانیو بەشدار بین لە جـەنگی رەوامان دژی دوژمنی رەگـەز پـەرست نـۆکـەرانی ئیمپریالیزمو زایۆنیزم . وە خۆمان بێ بەشی نەکەین لە شەرەفی بـەشداربـوون لە قادسیـەی صدامدا پێـویستە لە سـەرمان هەوڵدەین بۆ بە هێزکـردنی برایـەتی لە نێوان هـەردوو گەلی تێکۆشەر ... گەلی کوردو گەلی عەرەب ، گوێ لە پڕوپاگندەی دوژمنی روو رەش نەگرینو قسەی بە درۆ دەرخـەینو پتر لە هەموو وەختێك لە دەوری پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستو سەرۆکی خۆشەویست کاك صدام حسین کۆ ببینەوە ، چونکە هەر بەعسو کاك صدام نەورۆزیان کرد بە جەژنێکی رەسمی نەك هەر بۆ گەلی کورد بەڵکو بۆ هەموو جەماوەرانی عیراق .. هەر بەعسیو کاك صدام وشۆڕشی 17 — 30 تەمووز بەیاننامەی 11 ئـاداری ساڵی 1970 و یـاسای ئـۆتۆنـۆمی سـاڵی 1974 یـان بـڵاوکردەوەو کـوردیـان گـەیـانـدە رۆژێکی پـڕ لە ئـازادیو، سەربەستیو کامەرانیو بەختەوەری .

